# جەنگ لەگەڵ مەرگ و ژیاندا

ئەحمەد کامەران



چیرۆک

**ناسنامەی کتێب**

ناوی کتێب:جەنگ لەگەڵ مەرگ و ژیاندا

نووسینی:ئەحمەد کامەران

بابەت:چیرۆک

ساڵی چاپ:2022

قەبارە:١٤*٢١

بەرگ:نەهرۆ ستار

چاپخانە:لاس

## جەنگ لەگەڵ مەرگ و ژیاندا

منداڵێک ڕۆژی لە دایکبوونێکی جیاوازی دەبێت، تەنانەت ژیانێکی جیاوازتری هەبوو لەگەڵ منداڵەکانی ترا. ئەمەش وای لێکردبوو کە لە هەموو شوێنێک بە جیاوازتر دەرکەوێت،ئەو منداڵەش ناوی (ئامانج) بوو. لە خێزانێکی زۆر هەژارو دەستکورتدا لەدایکببوو. ئەم کوڕە خێر لەخۆنەدیوە هەر لەتەمەنێکی زوودا بە سەخترین قۆناغەکانی ژیانی هەژاریدا تێپەڕدەبێتن. لەپاش کۆچی دوایی باوکی دەبێتە قوربانی ئەو ژیانە سەختەی کە لەسایەی باوکییەوە هاتبووە ئاراوە بۆی،باوکی ئامانج پیاوێکی نەخوێندەوارو کورت بین بوو بۆ ژیان،بەبێ گوێدانە لایەنی ئابوورییەکەی هەستا بە خستنەوەی سێ منداڵ، کە بۆ دواجار ئەم

## جەنگ لەگەڵ مەرگ و ژیاندا

سێ منداڵە چاو گەشە باجی هەڵەی ئەندامە نێرینە گەرمەکەی باوکیان دەدەن.
ئامانج گەنجێک بوو، لە قۆناغی گەنجێتی ژیانی هیچ کاتێک دڵداری لەگەڵ هیچ کچێکدا نەکردبوو، چوونکە ئەو هەمیشە دەیگوت: من نامەوێت هیچ کاتێک بکەومە تەڵەی خۆشەویستی کچێکەوە کە داهاتوویەکی هەژار بنیات بنێم. ئەوکاتە خۆشەویستی دەکەم کە توانای بەرزڕاگرتنی ئەو خۆشەویستیەم هەبێتن.بەیانیانێک ئامانج بە چاوێکی پڕ لە ماندوویەتییەوە هەڵدەستێت و بەرەو کارکردن ملی خۆی شۆڕدەکات، لەسەری شەقامی کۆڵانەکەیان کچە دراوسێکەی تەنیشتیان دەبینێت کە بەرەو زانکۆ دەڕوات،کاتێک تەرزە چاوی دەڕوانێتە سەر ئامانج ، راستەوخۆ بە

## جەنگ لەگەڵ مەرگ و ژیاندا

زەردەخەنەیەکەوە سڵاویکی بەیانیانی لێدەکاتن،ئامانجیش زۆر بەساردی و سڕی وەڵامی سڵاوەکەی تەرزەی دایەوەو بەرەوکارەکەی خۆی ملی شۆڕکرد،ئەگەرچی ئامانج زۆر دڵی بەلای ئەو کچەوە بوو ، بەڵام هەژاری و سەختی و نەگبەتی نەیتوانی پێی بڵێت خۆشمەوێت.چیرۆکی ژیانی ئامانج و هاوشێوەکانی،رۆژانە لەم نیشتیمانەی خۆمان بەشێوەیەکی زەق بوونیان هەیەو بەردەوامیش لە هەڵکشاندا دەبێتن، بەهۆی نەبوونی یەکسانییەکی دادپەروەرانە بۆ سەرجەم تاکەکان. چاوەکانیان پڕ لە فرمێسکایەو، بە دەیان ئارەزوو ئاوات لەنێو ناخیان حەشارداوە کە زۆرجاران بەشێک لەو ئارەزووانەیان دەبەنە ژێر گڵەوە. ژیانە سەختەکەی ئامانج

## جەنگ لەگەڵ مەرگ و ژیاندا

بۆی دەبێتە وانەگەلێکی زۆر باش بۆی لە ژیاندا. بە گێڕانەوەی چیرۆکی ژیانی خۆیدا،دەیەوێت ئەوەمان پێبڵێت کە لە کاتی پڕۆسەی هاوسەرگیریدا تەنیا ڕەچاوی ناو گەڵمان و ئارەزووە کاتییەکانمان نەکەین،چوونکە لە دواجارا ئەوە منداڵەکانن دەبنە قوربانی ئارەزووە کاتییەکانی دایک و باوکیان. ئامانج پێی وایە بەختەوەرترین خێزانەکان ئەو خێزانانەن کە لە ڕووی ژمارەی خێزانی دیاری کراون،واتە ئەوانەی یەک بۆ دوو منداڵیان هەیە و زۆر بەختەوەر دەژین،بەو بڕە داهاتەی کە دەستیان دەکەوێت لە کارکردنا.

دەستپێکی چیرۆکەکە:

## جەنگ  لەگەڵ مەرگ و ژیاندا

کاتێک منداڵ بووم، ژیانێکی زۆر جوانم هەبوو چوونکە نەمدەزانی لە چواردەورەکەم چی دەگوزەرێتن!.جگە لە پێکەنین هیچ شتێکی ترم شکنەدەبرد ،بەڵام کاتێک بەپێی تێپەڕبوونی ساڵەکانی تەمەنی ژیانم کە گەورە بووم . لە گریان و خەم هیچی دیکە فێرنەبووم لەم ژیانەدا.خۆزگە بۆ بەشێکی زۆری مرۆڤەکان تەنیا ژیانی منداڵییان هەبوایە بەتایبەتیش بۆکەسێکی داماوی وەکو من.ژیانی من زۆر جیاوازە لە هەموو کەسێکی دیکەدا، کە پڕیەتی لە سەختی و دەردەسەری، هەموو ڕۆژێکم جەنگ بوو لەگەڵ مەرگ و ژیانی خۆمدا.خێزانەکەی ئێمە سەخترین ژیانیان هەبوو،کە بەردەوام بەدەستی هەژاری و کرێچێتیەوە دەمانناڵاند، هەرجارەو لە کرێی

**جەنگ لەگەڵ مەرگ و ژیاندا**

خانوویـــــەک نیشـــــتەجێ دەبـــووین، بـــاوکم پیـــاوێکی کرێکـــارو دەســـــتگێڕە شـــــڕەیەکی هـــــەبوو لـــــەناو بـــازاری شـــێخەڵا، بژێـــوی ژیـــانی رۆژانەی ئێمـــەی پێـــدابین دەکـــرد .رووخســـاری بـــاوکمم هەمیشـــە لـــەیادم مـــاوە کـــە پیـــاوێکی بـــاڵا بـــەرزی ئەســـمەری پشـــت کۆمـــاو بوو،کـــە هـــیچ کاتێـــک ئـــەو باوکـــەی مـــن نەیـــدەزانی مانـــای پێکـــەنین چییـــە؟ جگـــە لـــە گریـــان و رژانـــدنی کۆمـــەڵێک فرمێســـکی بێبەهایانـــە کـــە هـــیچ کاتێـــک ئـــەو فرمێســـکانەی بـــاوکم نـــەیتوانی ژیـــانی خـــۆش بکـــاتن تەنانـــەت بـــۆ چرکەیـــەکیش بێـــــتن.بـــــاوکی مـــــن ژیـــــانێکی زۆر ســـــەختی هـــەڵبژاردبوو کـــە ئـــەویش رەنجـــدان بـــوو لـــە پێنـــاو مـــــن و دوو خووشـــــکەکەم .ڕۆژێکیـــــان لـــــە قووتابخانـــە گەڕامـــەوە بینـــیم لـــەپێش دەرگـــای ماڵـــــەوە ئۆتـــــۆمبیلێکی فریاکـــــەوتن وەســـــتابوو.

## جەنگ لەگەڵ مەرگ و ژیاندا

خەڵکی هەموو گەڕەک لەپێش ماڵمان کۆببونەوە هەرچەندە ماڵی خۆمان نەبوو کە رۆژێک بە ئارامی تێیدا بحەسێینەوە. جانتاکەی سەرشانم فڕێدا سەرزەوی و بەڕاکردن بەرەولای ماڵەوە رۆیشتم، کاتێک نزیکی دەرگای حەوشەکەمان بووم راستەوخۆ دوو کارمەندی تەندرووستی باوکمیان خستبووە سەر قەرویڵەیەکی چوار تایەری.کە بەخێرایی بەرەو نێو ئۆتۆمبیلی فریاکەوتنەکە سەریان خست. لەولاشەوە دایکم بەگریان و لە خۆداین لەگەڵ تیمەکەی فریاکەوتن رۆیشت و منیش ئەو رۆژە ناچاربووم لەماڵەوە لای خووشکە بچووکەکانم بمێنمەوە...

کاتژمێر پێنجی ئێوارە بوو دایکم بە گریانەوە زەنگی بۆ کردم، هەستم کرد کە شتێکی

مەترسیدار بەسەر باوکمدا هاتووە ، دایکم بە ناخێکی پڕ لە گریانەوە پێی راگەیاندم کە باوکت کۆچی دوایی کردووە.ئیتر بۆ هەتا هەتایی ماڵئاوایی لەهەموومانی کرد.تەنانەت لەو ژیانە سەختەی کە ساڵانێک بە دەستیەوە گیرۆدە ببوو،تەنها مردنە هەژارەکان لە ژیانە ماندووکەرەکەیان رزگاریان دەکات.

دوو خووشکە جوانەکەم (دینەو زینە) دینە تەمەنی تەنیا چوار ساڵان بوو وە زینەی خووشکم هەشت ساڵان بوو. ئەوان زۆر هەستیان بەبوونی بێ باوکی نەدەکرد چوونکە لە سەرەتای بەهاری تەمەنی منداڵی خۆیان بوون، بەڵام من و دایکم لەو رۆژەوە خەنجەرێک لەسەر دڵماندرا. ئەوکات من

## جەنگ لەگەڵ مەرگ و ژیاندا

تەمەنم تەنیا چواردە ساڵان بوو،کەهیچ کاتێک خۆشیم لەو ڕۆژانەی خۆم نەبینی.
باوکمان ببووە پەردەیەک بۆ شاردنەوەی هەژاریەکەمان، لەهەمانکاتیشدا پردێک بوو لە نێوان ژیانی ئێمە و هەژاریەکەمان .کە هیچ کاتێک نەیدەهێشت ئێمە چێژی هەژاری بچێژین بەشێوەیەکی زەق،هەموو سەختیەکانی ژیانمانی دابووە سەرشانی خۆی بەتەنیا.
لەپاش کۆچی دوایی باوکم ئەو پردەگەورەیە رووخا کە ساڵانێک باوکم بنیاتی نابوو بۆمان . باوکم بڕبڕەی پشتی ماڵەکەمان بوو،ئەو باوکە ماندووەم لەتەمەنێکی زوودا بەهۆی ماندووبوونیەوە ژیانی خۆی بەختکرد بۆمان ، لەیادمە کە چەندەها جار لە کرێکاری لەسەر ئەسکەلەکان کەوتبووە خوارەوە بەڵام ئەو

پیاوە بەرگەی گرت و وازی نەهێنا لە پێناو ئێمەدا،بەڵام تا رۆژێک سەری خۆی خوارد و ئێمەی بۆ هەتا هەتایی بەتەنیایی لە ڕۆژگارێکی پڕاوپڕ لە ئاڵۆزی و ململانێدا بەجێهێشت.

لەو رۆژەوە کە باوکم ماڵئاوایی لە هەموانیکرد ژیانمان تاوەکو دەهات زۆر بەرەوسەختبوون دەڕۆیشت، ناچار بووم من بەشێکی سەختیەکانی ماڵەوە هەڵبگرم، کە ئیتر لەو تەمەنە کەمەوە دەستم دایە چەندین کاری جۆراو جۆر لەپێناو پەیداکردنی بژێوی خێزانەکەم.رۆژی وا هەبوو منێک کاتژمێر سێی شەو لە کار گەڕاومەتەوە بۆ لانە سڕوساردەکەمان.

هیچ کاتێک خۆشیم لە تەمەنی منداڵی و هەرزەکاری خۆم نەبینی بەهۆی ژیانی هەژاری

و بـــەردەوامی کـــار و ئـــەو قورسـاییانەی بەســـەر شـــانمەوە بـــوو، بەتایبـــەتی پـــاش ئـــەوەی کـــە دایکیشـــم لـــە پێیـــەکانی خـــۆی کـــەوت و توانـــای جوڵـــەکردنی نـــەما ئیتـــر ئـــەو کـــات مـــن زیـــاتر هەســـتم بـــە مانـــدووبوونی خـــۆم دەکـــرد . پـــێش ئـــەوەی دایکـــم بکەوێتـــە ســـەرجێگا هاوکـــارێکی باشـــم بـــوو کـــە شـــان بەشـــانی مـــن کـــاری دەکـــرد لەگـــــەڵما.ئەرکی سەرشـــــانمی ســــــووکتر کردبـــوو،بەڵام چـــارەنووس دایکمیشـــی لەپێیەکـــانی خۆی کەوت، تا رۆژی مردنی.

***

لەلایـــەکی دیکـــەوە مـــن دەســـتبەرداری خوێندنەکـــەم نەبووم.خوێندنەکـــەم تاکـــە رێگـــای دەربـــازبوونم بـــوو لـــەم ژیانـــە ســـەختە. هەربۆیـــە ناچـــاربووم لـــە قووتابخانەیـــەکی شـــەوان نـــاوی خـــۆم تۆماربکـــەم

و درێژە بە خوێندنەکەم بدەم. کاتێک تەماشای خۆم و منداڵی خەڵکیم دەکرد کە من چۆن دەژیم و ئەوانیش چۆن دەژین، ئەوان دەم بەخەندەو دڵخۆش بوون. هەموو شتێکیان بۆ فەراهەم کرابوو لەلایەن دایک و باوکیانەوە. کەچی منێکی داماویش چاو بەفرمێسک و خاوەنی دڵێکی مردوو بووم. منداڵی خەڵکی لە باشترین خوێندنگەکان دەیان خوێند منیش وەکو شەمشەمە کوێرەکان لە قووتابخانەیەکی شەوان درێژەم بەخوێندنەکەم دەدا، بەشێکی ئەوانەی لەگەڵم بوون لە خوێندنگەی شەوانیەکەدا لە رووی پەروەردەو ئاستی رۆشنبیری داشۆرابوون.

منێک بەناچاری لەگەڵیان راهاتبووم،چوونکە هیچ چارم نەبوو هەروەها نەشمتوانی

بگەڕێمەوە بەر خوێندنی بەیانیان بەهۆی زۆری کارکردنم لە بەیانیان،یاخود وەکو منداڵی خەڵکی پارەم نەبوو لە قوتابخانە تایبەتییەکان بخوێنم.بەڵام ڕۆژێکیان بیرم لەخۆم کردەوە کەوا باشە من چیتر چاوم لەسەر منداڵی فڵان و فیسار هەڵبگرم،چوونکە ئیتر ئەمە چارەنووسی منە کە لە ڕێگای باوکمەوە ئەم چارەنووسەم بۆ دیاری کرابوو،کە دەبێت باجی هەڵەکانی باوکم بدەمەوە. بێگومان من هیچ تاوانێکم نییە کە باجی ئەم سەختیانە بدەم. ئەگەر بمزانیبایە ژیانم بەم ڕێگایە هەنگاو دەنێت ،ئەوا نەفرەت لەو رۆژە دەکەم کهوا لەدایکبووم.

هەژاری وایلێکردبووم کە خواردنی پارچەیەک پیزای گەرم بۆ منێک قەدەغەوئەستەم بێتن ئیتر

لەمە زیاتر چی؟،کاتێک رۆژانە لە کار
دەگەڕامەوە بەلای هەندێک شوێندا تێپەڕیم
وەکو (چێشتخانەی شاهانەو شوێنی یاریکردن
و چەنەها شوێنی ناوازەی دیکە کە بەبینینیان
چاوەکانم فرمێسکیان لێدەباری.بەڵام کاتێک
دەستم بۆگیرفانی دڕاوی خۆم برد تەماشا
دەکەم دوو دینارۆکەک تێدایە ،کە ئەویش
دەبێت بیدەمە پارووە نانێکی گەرم بۆ
ماڵەوەمان).

رۆژانەیکی کەمم دەستدەکەوت لەو کارانەی کە
ئەنجامم دەدا کە زۆر جاران بەئەستەم بەشی
خێزانەکەم و کرێی خانووەکەمانی دەکرد،
ئەگەرچی لەپاش کۆچی دوایی باوکم خاوەن
ماڵەکە کرێیەکەی لەسەرمان کەمی کردەوە بۆ
سەد هەزار دیناری عێراقی ، بەڵام ئەو بڕە

پارەیـــــە بــۆ ئێمـــــە زۆر بـــوو لە چـــاو ئەو پـــارەیەی کە من لە کارکردن دەستم ئەکەوت.
ڕۆژانـــــە لــــــەکرێی کارکردنەکـــــەم تـــــوانیم چەنـــــد دینـــارێکی کـــەم بـــۆ خـــۆم جـــار بـــەجار پاشـــەکەوت بکـــەم، ئـــەویش بـــۆ کڕینـــی هەنـــدێک کتێـــب و گۆڤـــار. کـــە زۆر ئـــارەزووم لـــە خوێندنـــەوە هـــەبوو، لـــە ڕێگـــای خوێندنـــەوەی ئـــەو کتێـــب و گۆڤارانـــەی کـــە دەمکـــڕین شـــتی نـــوێی و جـــوانی تێـــدا فێربـــووم . ئەگـــــەرچی هەنـــدێک لـــــە کتێبـــەکان نرخیـــــان زۆر گـــــران بـــــوو منـــــیش توانـــــای ئـــــەوەم نـــــەبوو بەدەســــــتیان بێنم.یــــــاخود خــــــاوەنی ئــــــامێرێکی پێشــــــکەوتووی ئەلیکترۆنـــــــی نەبـــــووم، بـــــۆئەوەی کتێبەکـــــان بەشـــــێوەی ئەلیکترۆنـــــی دابەزێـــــنم بـــــۆ خـــۆم. مامۆســـتا شـــەوکەت یـــادی بـــەخێر لـــە بـــازاڕی ڕۆشـــــــنبیری کتێبخانەیـــــــەکی هــــــەبوو ،ناوبـــــــەناو

هەندێک لەو کتێبە گرانبەهاکان بە خۆڕایی یان بە بڕێکی کەم پێی دەدام تاوەکو چێژیان لێوەرگرم، هەستم دەکرد لەپاش هەر کتێبێک کە تەواوم دەکرد ئەو سەختیەی سەرشانم لاواز دەبوو. کتێبەکان وەکو جادوگەرێک وابوون بۆم کە رۆیشتبوونە نێو دڵمەوەو ئازارەکانی دڵمیان بەشێوەیەکی کاتی چارەسەر دەکرد.بەڵام نەیان توانی بۆهەتا هەتایی چارەسەری بکەن. شتێکی ئەستمە کە ڕەنگە بەپێی تێپەڕبوونی رۆژگار چاکببێتەوە یاخود تاوەکو مردنم بمێنێت ئەو زامەی دڵم. دڵە زامدارەکەی من،لە پێناو باڵاو چاوی جوانی کچێکی ناسکۆڵەی چاو نەشمیلانێ بریندار نەکراوە،بەڵکو لە ئەنجامی هەژاری و سەختی ئەم ژیانە نادادپەروەرە زامدارکراوم. خۆزگە

منـــــیش لەلایـــــەن کچێکـــــەوە دڵـــــم زامـــــدار بکرابایە،نـــــەکو بە هەژارییـــــەکی نـــــەگریس منێکـــــی بێدەسەڵات زامداربکرێم...

جارێکیـــــان کـــــە کتێبـــــێکم بەدەســـــتەوە بوو،راســـتەوخۆ خـــەیاڵم کـــرد کـــە رۆژێـــک بێـــت مـــن ببمـــــە نووســـــەرو ئەکتـــــەرێکی لێهـــــاتوو ،بـــــە پێکەنینـــەوە بـــە خـــۆمم گـــوت: هـــەی ئامانجـــە خـــەون حوشتر،هەربەڕاســـــتی خـــــەونی زۆر گـــــەورەو پەمـــــــەیی دەبیـــــــنم لـــــــەم ماوەیـــــــە. مـــن لـــەکوێ و نووســـەری و ئەکتـــەری بـــۆ منێـــک کوجـــا مەرحـــەبا، منێکـــی دامـــاو بـــەردەوام ئـــەبێت راکـــە راکـــەم بێـــت لـــەملاو بـــۆ ئـــەملا بـــۆ پەیـــداکردنی دوو لوقمـــە نـــانی گەرم بۆخـــۆم و خێزانەکـــەم. ئـــەو کاتـــەم لـــەکوێ دەبێـــت کـــە بـــۆ نووســـەر بـــوون تـــەرخان بکـــەم؟ واهەســـت دەکـــەم رۆژ بـــەرۆژ بـــەم

خەونـــــە خۆشـــــانەوە ئـــــەقڵم لەدەســــــت دەدەم.ئەم جـــــۆرە شـــــتانە هـــــی ئەو گەنجـــــانەیە کە ژیـــــانێکی ئارامیان هەیەو،بیرلە داهێنان دەکەنەوە.
واباشـــــربوو هەســـــــتمەوهو برۆمـــــە لای کارەکـــــەی خـــــۆم باشـــــترە بـــــا بـــــەم خەونـــــە بێمانایـــــانهوە لـــــە کارەکەیشم دەرنەکرێم.
هەســـــتێکی تـــــرم هـــــەبوو کـــــە لەناخـــــەوە هێـــــزی پێبەخشـــــیم و پێـــــی دەگـــــوتم: ئامـــــانج تـــــۆ لەبـــــەردەم تاقیکردنەوەیـــــەکی ســـــەختی ژیانـــــدا خۆتدەبینیتـــــەوە، بۆیـــــە هـــــەرگیزهیچ کاتێـــــک لـــــەنیوەی رێگـــــا ئـــــەم تاقیکردنەوەیـــــــە بـــــــەجێ نەهێڵیت.چوونکـــــــە ئـــــــەم تاقیکردنەوەیـــــە کاتییـــــە و لەپاشـــــان ژیـــــانێکی جوانـــــت بەڕووتـــــــدا دەکرێتەوەوســـــــەرجەم نەهامەتیـــــــەکانی قۆنـــــاغی هـــــەرزەکاری و منـــــداڵیت لـــــەیاد دەکـــــەیت، ئەمـــــەش بـــــەو مەرجـــــەی کـــــە بتـــــوانی لـــــەم

تاقیکردنەوە سەختە نمرەیەکی باش بهێنیت . ئیتر ئەوکاتە بە هەموو خۆشیەکانی ژیان شاد دەبیتەوە.ئەوهەستەی ناخم لەو رۆژەوە بووە پاڵنەرێکی گەورە بۆم، کە بەئاسانی لە نیوەی رێگا خۆم نەدەمە دەستی سەختیەکانی ژیانم، ژیانی من وەکو جەنگێکی خوێناوی وایە . بۆیە منیش دەبێت ببم بەسەربازێکی لێهاتوو تاوەکو بتوانم بە بەهێزی لەم گۆڕەپانە فراوانەدا جەنگ لەگەڵ سەرجەم ئەو بەربەستانەی پێشی خۆمدا بکەم کە دێنە سەرێگای ژیانم.

لە سەردەمێکدا دەژیم هیچ کەسێک خەمی کەسی تری نییە تەنیا دەبێت خۆت خەمی خۆت بخۆیت.ئەگەرنا بەزیندوویی لە بەیانیەکی رووناک زیندەبەچاڵ دەکرێی.

تەنانەت هیچ کەسێک نایەت بەلاتەوە دەستت بگرن و بتخەنە سەر پردی ژیان. سەرباری ئەوەش هەمیشە هەوڵدەدەن ئەو پردەی کەبە ماندووبوون دەتەوێت بنیادی بنێی ئەیانەوێت بیڕوخێنن بۆم بۆئەوەی لە دۆڵی مەرگی ژیان نغرۆببم.

ئێوارەیەک بە رووخسارێکی ماندوو لەگەڵ جەستەیەکی لاواز لە کار گەڕامەوە ،بەڵام پێش ئەوەی بەرەو ماڵ بڕۆم راستەوخۆ بەرەو گۆڕستان رۆیشتم لە کەسنەزان بۆ سەردانی گۆڕی باوکی کۆچکردووم. کاتێک گەیشتمە لای گۆڕەکەی باوکم ، مەنزڵگەکەی باوکم هەروەکو خۆی مابوو کە نەمان توانی بە کاشی و مەڕمەرێکی شاهانە بۆی بڕازێنینەوە.

بـــڕە پارەیـــــەکی زۆری دەویســـــت ئێمـــــەش ئـــــەو پارەیـــــــەمان پـــــێ پەیانـــــــەدەکرا کـــــــە بـــــۆی بکەین،تەنانـــەت باوکیشـــم لـــەپاش مردنـــی نـــەیتوانی مەنزڵگەیەکی جوان بۆ خۆی بڕازێنێتەوە.
ئـــاخ بـــاوکە تـــۆ رۆیشـــتی و ســـێ منـــداڵت بەدوای خۆت بەهەژاری بەجێهێشت.بخەوە بە ئارامی...

***

چەپکـــــە گوڵێـــــک و هەنـــــدێک ئـــــاوڕێژی ســـــەر گۆڕەکـــەیم کـــرد تـــاوەکو بـــاوکم لـــەنێو ئـــەو چاڵـــەدا هەســـت بـــە فێنکـــی بکـــات ،بـــاوکم زۆر ئاشـــقی گـــوڵ بـــوو، هەمیشـــە بـــەبۆنی گوڵـــەکان هەســـتی بـــەئارامی دەکرد.ئـــەم شـــوێنە کـــش و ماتـــە کـــە بـــەدەیان کـــەس بـــۆ خۆیـــان بەبێـــدەنگی پاڵیانداوەتەوە،لەنێویشـــیاندا باوکـــــە ماندووەکـــــەی منـــــیش بـــــە ئـــــارامی لەم شـــوێنە بـــۆ خـــۆی پشـــوودەدات ، بـــاوکم لـــەماڵی

خـــۆی هـــیچ کاتێـــک پاڵدانـــەوەو پشـــوودانی لـــێ زەوتکرابـــوو. دایـــم لـــە راکـــە راکـــە بـــوو بـــۆ ئێمـــە تـــاوەکو پـــارووە نـــانێکی گـــەرم بۆمـــان بهێنێتـــەوە بۆ هێلانەکەمان.

گۆڕســـتان بەلای مـــنەوە ئـــەو شـــوێنە جوانەیـــە کـــە مرۆڤـــە پاکـــەکان و مانـــدووەکان تێیـــدا بـــە ئـــارامی دەحەســـێنەوە بـــۆ هـــەتا هـــەتایی بـــەبێ ئـــەوەی هـــیچ کەســـێک مانـــدوویان بکات.ئـــەو جـــۆرە مرۆڤـــانەی هاوشـــێوەی بـــاوکم، هـــیچ کاتێـــک لـــە ژیـــان بـــۆ چرکەیـــەکیش بێـــت نـــەیان توانیـــووە بـــە ئـــارامی خـــــەوێکی خۆشـــــی زســـــتانان لـــــەچاوەکانیان بڕواتن،کەچـــــی هەر بەدوای پەیـــــداکردنی نـــــانەوەن بە پـــارەیەکی کەمیش،لەلایەکـــی دیـــکەوە کەســـانێک بەلامـــانەوە تێـــدەپەڕن بە دووکـــاتژمێر کەمتـــریش کـــارکردن ئـــارامترین ژیانیـــان هەیە.هاوشـــێوەکانی

باوکم لێرەدا بۆخۆیان چاوەکانیان لێک ناوەتەوەو،خەمی هیچیان نییە.هەرکاتێک بچووبامایە سەر گۆڕی باوکم ئەوا، هەندێک دەردە دڵیم لەگەڵ باوکم کرد، هەرچەندە ئەو گوێی لەمن نەبوو بەڵام قسەکانی ناخی خۆم کردو پێم گوت:باوکە لەپاش تۆ من زۆر ماندووم لەم ژیانە دوو رووەدا، ئیتر نازانم تاوەکو کەینێکە بەرگەی سەرماو گەرما و سەختی و نەبوونی دەگرم، باوکە تۆ ئاگەداری کە من لەپاش تۆ هەموو بەیانیانێکی زوو چاوەکانم لەخەو ڕادەپەرێت، ئیتر وەکو دێوانەیەک لەملا بۆ ئەولا دەکەم بۆ پەیداکرنی پارووە نانێکی گەرم بۆ دایکە نەخۆشەکەم و دوو خووشکە بچووکەکەم. شەشەمین جارمە کە پێڵاوەکەی پێم دەدڕێت و منیش بەناچاری

پینەی دەکەم بەهۆی نەبوونیمەوە.ئەگەر بمزانیبایە ژیان ئەوەندە بۆمن سەختە هیچ کاتێک ئارەزووم نەدەکرد لە دایک ببم.من و دوو خووشکەکەم ئارەزوو دەکەین وەکو ژیانی منداڵی خەڵکی خۆش بژین،دوێنی کاتێک لە کار گەڕامەوە زینەی خووشکم داوای پاسکیل و بووکەڵە شووشەم لێدەکات منیش بەڵێنم پێداوە کەبە هەر شێوەیەک بێت بۆی بکڕم.

ئەی باشە کێ بۆمن شت بکڕێت؟

باوکە تۆ ڕۆیشتیت و هەموو قورسایەکانی ئەم ژیانە کە پڕیەتی لە مرۆڤی بێوەفا هەموویت یا بەسەرشانی منا، منیش ناچارم لە پێناو خۆم و خێزانەکەم جەنگ بکەم بۆ ئەوەی بە زیندوویی بمێنینەوە لەم ژیانە کولەمەرگیەماندا.

کاتێــــک لەســــەر گــــۆڕی بــــاوکم هەستامەوە،لەپاشــــان بــــەنێو ئــــەو گۆڕســــتانە فراوانــــە دەرۆیشــــتم بە پیاســــەیەک . کــــە بینــــیم لەهــــەر ســــووچێکی ئــــەم گۆڕســــتانە فــــراوانە چەنــــدین گــــۆڕی ســــارد و ســــڕ ئەهاتــــە پــــێش چاوەکــــانم کــــە هەریەکــــە لــــەو گۆڕانــــە کەســــێک بۆخــــۆی لەنێویــــدا پاڵیداوەتــــەوە بەبــــێ ئەوەی بزانم لەنێو گۆڕەکاندا چی دەگوزەرێتن!
چــــوار گــــۆڕم بینــــی لــــەنێو ئــــەو گۆڕســــتانەدا کــــە لەتەنیشــــتی یەکــــەوە بــــوون دانەیــــەکیان باوکــــە بــــوو ئــــەوی تــــریش دایکەکــــەیان بــــوو لەگــــەڵ کچەکــــەی و کــــوڕەکەی کــــە هــــەرچواریان لەتەنیشــــتی یــــەکترەوە نێژرابـــــــــوون،بەبینینی ئەو دیـــــــــمەنە زۆر پێیـــــــــان کاریگــــەر بــــووم. چــــوون بۆگۆڕســــتان شــــوێنێکی ئێجگــــار جیــــاوازە لەهــــەموو شــــوێنەکانی دیکــــە کــــە رۆژانــــە ســــەردانیان دەکــــەین. ئەگــــەرچی هەســــتم

بەدڵتەنگی دەکرد لەنێو ئەم گۆڕستانە بێدەنگە کە بەدەیان مرۆڤی مردوو تێیدا نێژرابوو،بەڵام لەلایەکی دیکەوە بە زەردەخەنەیەکەوە بەخۆمم گوت: ئاخ ئامانج تۆش رۆژێک دێیتە ئێرە و دەچیتە ژێر ئەم خاکە تاریک و بێدەنگە ئەگەر بێت و لێی بێبەش نەبم. زۆر کەس هەیە ڕۆژانە پارچە گۆڕێکیانیش نابێتە بەشیان.

نازانم لەپاش مردنم چارەنووسم چی لێدێت و بەرەو کوێ گەشت دەکەم؟
مردن گەشتێکە تەنها کەسی مردوو خۆی دەزانێت چارەنووسی چی لێدێت ،خۆزگە بمزانیبایە باوکم لەکوێیە ئێستاکە!
ئەگەر ببمە نووسەر و ئەکتەر یان فەرمانبەر و مامۆستا یان پزیشک و ئەندازیار یاخود وەزیر و سەرۆک، هەمووی لەکۆتاییدا بەچاوتروکانێک

لەدەســـــتیان ئەیەم،تـــــەنیا ئـــــەم شـــــوێنە بێنـــــازە پێشـــوازیم لێـــدەکات بەپارچـــە زەوییـــەکی باریـــک و تـــاریکی چـــارەنووس نادیار.کەواتـــە چیتـــر پێوســـت ناکـــات مـــن بـــۆ بەدەســـتنەهێنانی شـــتێک دڵگـــران بـــبم. لەکۆتاییـــدا بـــەهۆی مردنـــەوە لەدەســـتی دەدەم بـــۆ هـــەتا هـــەتایی هـــیچ کـــاتێکیش نابێتـــە مـــــوڵکی مـــــن، بەڵام تـــــاوەکو ئەوڕۆژەی کە لە ژیـــانم منـــی مـــرۆڤ دەبێـــت بەبەردەوامـــی ئـــاوات و خەونم هەبێت بۆ ژیانی خۆم.
ئـــەم شـــوێنە کـــە پێـــی دەڵـــێن گۆڕســـتان مـــاڵی هـــەموو کەســـێکە، ئـــەوەی ئـــاین و ڕێبـــازی جیـــاوازە یـــاخود ئـــەوەی لەهـــەر پلـــەو پۆســـتێک خزمـــەتی کـــردووە ڕۆژێـــک لـــە ڕۆژان،پـــێم وایـــە مـــردن هـــیچ کەســـێک لـــە ئێمـــە ناناســـێت،ئەم شـــوێنە ڕۆژانـــە هەریـــەکێک لـــە ئێمـــە بـــۆلای خـــۆی ڕادەکێشـــێت بـــۆ

شوێنێک کە هەمووکەسێک چاوەڕێیەتی ڕۆژێک لە شەمەندەفەری مەرگ دابەزێت.

پاش پێنج ساڵ لە کۆچی دوایی باوکم، لە شەوێکی درەنگی کش وماتا دایکیشم چیتر بەرگەی ئەو ئازارەی نەگرت، کە ماوەی چەندین ساڵە بەدەستیەوە ئەینالاند.دایکم لەپاش کۆچی دوایی باوکمەوە تووشی چەندین نەخۆشی کووشندە بوو کە نەمان توانی تەنانەت چارەسەرێکی سەرەتاییش بۆی بکەین، بەهۆی نەخۆشییەکەیەوە نەیتوانی بەرگە بگرێت ،ئیتر وای لێهات تاوەکو ئەو ڕۆژەی چاوەکانی لێکنا هەر لەسەر جێگاکەی خۆی نەیتوانی هەڵسێتەوە سەرپێیەکانی خۆشی .

ئەمەش بۆمن قورساییەکی دیکە بوو لەسەرشانم کە لەلایەک کاری دەرەوەو لایەکی

## جەنگ لەگەڵ مەرگ و ژیاندا

دیکـــــەوە بـــــەخێوکردنی دایکـــــم و لەگـــــەڵ ئەوەشـــــدا بەردەوامیم لەخوێندن.
بـــۆ دواجـــار لـــە درەنگـــانێکی شـــەو دایکیشـــم کۆتـــایی بـــەو ئـــازارەی هـــات و بـــەرەو مەنزڵگـــەی ئـــارامی بەڕێکـــــەوت و لەتەنیشـــــتی باوکمـــــەوە بـــــەخاکمان سـپارد. مـــن و دوو خووشـــکەکەم بـــەبێ دایـــک و بـــاوک ماینەوە.دینـــە و زینـــەی خوشـــکم رۆژ بـــە رۆژ ئـــــەوانیش گـــــەورە بوون،زینـــــە و دینـــــە دووکچـــی ژیـــر و تێگەیشـــتوو بـــوون ،هـــەروەکو خـــۆم وابـــوون، ئـــەوانیش لەگـــەڵ ســـەختییەکانی ژیـــان جـــەنگیان دەکـــرد. مـــن زۆر شـــانازیم پێیانـــەوە دەکرد،بەشـــێکی قوربانیـــەکانم لـــە پێنـــاو ئـــەو دوو خووشـــکەی خـــۆم بـــووە،هیچ کاتێـــک نەمهێشـــــــتەوە هەژاری کـــــــاریگەری بکـــــــاتە ســـــــەرژیانی دوو خوشـــــــکەکەم بـــــــۆ ئەوەی

**جەنگ لەگەڵ مەرگ و ژیاندا**

نــــامەردێکی نــــاو گەڵ گەرمـــــی بـــۆگەن ئەو هەلە بـــۆ خـــۆی نەقۆســــتەوەو خووشـــکەکانم بکـــاتە کـــالآیەک بۆخۆی.

هەژاری وا لە مرۆڤانێــــــک دەکەن کە دەســــــت بــــۆ هەمــــوو کارێـــک بـــــبەن، بەتـــــایبەتیش کچـــــان و ئافرەتـــــان، ســــالآنێکی زووە ئافرەتێـــــک بەنـــــاوی ســــــــاجیدەوە دەناســــــــم، بەڵام شـــــــــوێنی نیشـــــتەجێبوونەکەی نــــــاڵیم چـــــوونکە پێویســــــت ناکـــات کەس شـــوێنی بزانێـــت. ئـــافرەتێکی تـــابڵێی زۆر بەڕێـــــــزو میهرەبـــــانە کە چەنـــــدین جـــــار هاوکـــــاری مـــــن و خووشـــــکەکانمی کـــــردووە ، بەڵام رۆژێکیـــــان هەژاری گەیشـــــتە تنـــــۆکی ســـــاجیدەی دامـــاو، ئیتـــر ئەو ئـــافرەتە لە نـــاخەوە یـــاخی بـــوونی راگەیانـــــد، کە بڕیاریـــــدا ببێـــــتە لەشـــــفرۆش و ئـــــافرەتێکی ســـــۆزانی . جارێکیـــــان ســـــاجیدە لە

## جەنگ لەگەل مەرگ و ژیاندا

باخچەیەکـــــا بە ڕێـــــکەوت چـــــاوم پێـــــیکەوت و
لەگەڵـــــی دانیشـــــتم هەنێـــــک لە ســـــەختییەکانیژیانی
خـــــۆیی بـــــۆمن گێـــــڕایەوە بەم شـــــێوەیە: هەمـــــوو
شـــــەوێکی مـــــن لە باوەشـــــی چەنـــــدین پیـــــاوە قەڵەو و
تـــــرخێنە بۆگەنەکـــــان شـــــەوەکانم بەڕێ دەکەم،
خـــــۆزگە تەنیـــــا لە باوەشـــــیان بوومـــــایە، ســـــەرباری
ئەوەش لەســـــەر ئەنـــــدامە نێـــــرینە زلە
بۆگەنەکەیشـــــیان وەک منـــــداڵ جـــــۆلانێ دەکەم بـــــۆ
چەنـــــدین کـــــاتژمێر تـــــاوەکو ئـــــارەزووە ئاژەڵیەکەیـــــان
دێـــــتە خـــــوارەوە،لەگەڵ چەنـــــدەها ڕووداوی
ناخۆشـــــتر کە لە شـــــەوانی بەناو(ســـــور) مـــــن
بەدەســـــتی ئەوشـــــەوە قێـــــزەونەوە دەنـــــاڵێنم، لەو
شـــــەوەدا چەنـــــدین کەســـــانی جیـــــاواز خۆیـــــان
لێمنێزیک دەکەنەوە بۆ دەستە گانێک.

***

ئیتر لەمە زیاتر ناتوانم هەموویت بۆباس بکەم.بۆیە با سەری تۆش نەیەشێنم ئامانج گیان کاتێکی خۆش بە قوربان ئاگات لە خۆت و دوو خووشکەکەت بێت...

ئەو خانووەی کە تێیدا بووین بە کرێ، بەجێمان هێشت و بەرەو شوقەیەک رۆیشتین لەوێ نیشتەجێ بووین. چەند بە ئاواتی ئەوە بووم رۆژێک شوقەیەک یان ماڵێکمان هەبێت و بە ئاسوودەیی تێیدا بژیم من و خوشکەکانم.

بەشێک لەهاورێکانم کە لە زانکۆ پێکەوە بووین ژیانی هاوسەرگیرییان پێکهێنابوو، هەندێکیان لە کاتی زانکۆ وە هەندێکی تریشیان لە پاش تەواوبوونی زانکۆ چوونە ئەو پرۆسەیەوە.ناوبەناوە بەمنیان دەگوت: ئامانج

تــــۆش کـــــەی دەبیــــت بــــە زاوا؟ پرســـــیارێکی زۆر بێمانـــاو بازاڕیانـــە بـــوو کـــە لەلایـــەن هاوڕێکانمـــەوە لـــێم دەکـــرا بـــەڵام زۆر گـــوێم بـــۆ ئـــەو پرســـیارانە شـــل نـــەدەکرد. مـــن هـــیچ کاتێـــک پڕۆســــەی هاوســـەرگیری لـــەنێو میشـــکی خـــۆمم دانـــەنابوو. مـــن بـــە چەنـــدین قۆنـــاغی ســـەختی هەژاریـــدا تێپـــەڕیبووم، ئـــەو قۆناغانـــەی کـــە مـــن تێیـــدا تێپـــەڕبووم ســـەرجەمیان بـــۆمن وانـــە بـــوون بـــۆ ژیـــانم ،کـــە جـــارێکی تـــر ئـــەو وانـــە ناخۆشـــانە دووبـــارەی نەکەمـــەوە. ئەگـــەر بێـــت و ئێســـتا مـــن پڕۆســــەی هاوســـــەرگیری ئـــەنجام بـــدەم ئـــەوا دووبـــارە ژیـــانێکی ســـەخترم دێتـــەوە پـــێش ، کـــە ئـــــەمجارەیان جگــــە لــــە خــــۆم منداڵەکــــەم و هاوســــەرەکەم باجەکـــەی دەدات،تەنانـــەت بـــە قورسترین شێوەش باجەکەی دەدەن.

هەروەکو چۆن باوکم کۆچی دوایی کرد من باجی هەژارییەکەی باوکم دا .هەزاران خەونی جوانی منداڵیم و هەرزەکاری و گەنجیم هەمووی بەهۆی هەژارییەوە لە گۆڕنران.قۆناغی ژیانی هەرزەکاریم سەخترین ساڵەکانی تەمەنی من بوو لە ژیانم . کە زۆر ئەستەمە لە یادیان بکەم، بەتایبەتی ئەو رۆژانە لەتاو سەرمای سەختی زستان و بە پێڵاوێکی دڕاوی پینەکراو لە کارکردن بووم . هەموو دەستەکانم لەتاو سەرما دەلەرزین،بۆیە ئێستاکە زۆر ئەستەمە ئەو ژیانە دووبارە بکەمەوە.چوونکە من وانەگەلێکی گرنگ فێربووم لەو سەختیانەی ژیانم ،کە ئیتر ئێستا خۆم باش دەزانم چۆن هەنگاو دەنێم بەرەو پێشەوەو بۆ ژیانێکی جوانتر و ئارامتر.

نامـــەوێت منداڵەکـــەم هـــیچ کاتێـــک چێـــژی هـــەژاری ببینێت.تەنانـــەت بـــۆ چرکەیـــەکیش ڕێگـــا نـــادەم ژیـــانێکی ناخۆشـــی هـــەبێت ، هـــەروەها هـــیچ کـــاتێکیش بـــۆی باســـناکەم کـــە باوکـــت بـــە چەنـــدین قۆنـــاغی ســـەختی هـــەژاری تێپەڕیوە،ئـــەوەی مـــن چەشـــتم لـــەم ژیانـــە، تـــەنیا ئـــاوات دەخـــوازم هـــیچ کاتێـــک بەســـەر دووژمنەکەیشـــمدا دووبـــارە نەبێتـــەوە. تـــەنیا خـــۆم هەســـت بـــە ئـــازارە ســـەختەکەی دەکەم، تـــاوەکو ڕۆژی مـــردن ئـــازاری ئـــەو ڕۆژە تاڵانـــەی ژیـــانم لـــەپێش چـــاوم وناو مێشکم دەمێنێتەوە.

ئەوکاتـــە دەبـــم بـــە بـــاوکێکی بـــاش کـــە خـــاوەنی ئابوورییـــەکی مســـۆگەرکراوم. بـــۆ ئـــەوەی بتـــوانم داهـــاتووی خـــۆم و منداڵەکـــەم لـــە ڕێگـــەی ئـــەو داهاتـــەوە کـــە هەمـــە ژیـــانی منداڵەکـــەم زۆر

بــەجوانی و بــێ کــەم و کــورتی مســۆگەر بکەم.ئــەم ســەردەمەی کــە مــن ئێســتا تێیــدا دەژیــم کــەمێک گـــــۆڕانی بەســـــەرهاتووە،واتە هاوشـــــێوەی ســـــەردەمەکانی پـــــێش خـــــۆم نیـــــیە کە بە ســـــەردەمانی ســـــادەیی و بـــــاوەڕکردن بە شـــــتە جوانەکــان ناســـرابوون ،مرۆڤەکــان ئەوکــات دڵیــان بە شـــــتانێکی ســـــادەوە خـــــۆش بـــــوو بەڵام ئێستاکە...!!!

رۆژ بـــــە رۆژ پێداویســـــتیەکان و خواســـــتەکان زۆر دەبـــن بەتایبـــەتیش منـــداڵی ئێســـتا دەبێـــت باشـــترینەکان بۆیـــان بکـــەین وەکـــو بـــاوک و دایک،چوونکــە تــەنیا بــەخێوکردن گرنــگ نییــە بــۆ منـــداڵەکانمان بە پـــاروویەک نـــان، بـــەڵکو

**جەنگ لەگەڵ مەرگ و ژیاندا**

فەراهـــــەمکردنی ژیـــــانێکی ئـــــارام و شایســـــتە بـــــۆ منداڵەکەم گرنترینیانە بەلامەوە.

بـــاوکم کاتێـــک بڕیـــاری هاوســـەرگیریدا هـــیچ کاتێـــک بەشـــــێوەیەکی دووربینانـــــە نەیڕوانیـــــە داهـــــاتووی خـــۆی و ئێمـــــە ،هەربۆیـــــە دەرئەنجامەکـــەی بـــــەو رۆژە ســـــەختانە گەیشـــــتین کـــــە هـــــیچ کاتێـــــک نەبووینـــە خـــاوەنی پارچـــە زەوییـــەکیش. ئەگـــەرچی جاروبـــار هەســـتێک لـــەناو ناخمـــەوە وام لێـــدەکات لـــەباوک تـــووڕەبم ،بـــەڵام ســـەرباری ئـــەوە مـــن هـــــــــەرباوکم خۆشـــــــــدەوێت و شـــــــــانازی پێوەدەکەم.چوونکـــە ئـــەو لـــەم ژیانـــەدا کـــە کاتێـــک کـــۆچی دوایـــی کـــرد، وانەیـــەکی گرنگـــی فێرکـــردم کە ئەویش بریتی بوو لە وانەی (بیرکردنەوە).

هەژاری و دەردەسەری لە ئەنجامی بیرنەکردنەوەیکی فراوان دێت لەلایەن مڕۆڤەکانەوە بۆیە مڕۆڤ دەبێت خاوەنی بیرێکی فراوان بێت لەژیانیدا نەک وەکو ئاژەڵی دارستانەکان مامەڵە بکاتن، لە کۆتاییدا من مڕۆڤم دەبێت لە ئاستی مڕۆڤبوونی خۆم بژیم کە ئەویش مێشک و بیرکردنەوە دوورەکانمە. ئەوەی من فێری بووم لەژیانم، ئەوەیە کە ئەم ژیانە وەکو جەنگ وایە دەبێت سەربازێکی باش بیت لە پێناو مانەوەتدا ، ئەمەش تەنیا لە ئەنجامی بیرکردنەوەی باش دیت،نەک بەهێزی جەستە. زۆرجار هێزی جەستە ناتوانێت زاڵبێت بەسەر هەندێک کێشەو سەختیدا،بۆیە دەبێت لەگەڵی مێشکێکی فراوان هەبێت بۆ

بیرکردنەوەی جوان و تەندرووستانە،تاوەکو لە سەرجەم کێشەکان دەرباز ببین.

رۆژێکیان لەگەڵ یەکێک لە هاوڕێکانی زانکۆم لە باخچەی زانکۆکەمان پێکەوە دانیشتبووین، ئەو هاورێیەم پێ گوتم: ئامانج دەزانی خۆشترین ڕۆژی من لە ژیانم چییە؟

-منیش خۆم سوڕاندەوە بۆلای هاورێکەم کە هەڵە نەبم ناوی نیهاد بوو کوڕێکی کورتەباڵای سووره بوو. منیش بە نیهادم گوت: خۆشترین ڕۆژی تۆ چییە نیهاد؟

-نیهادیش گوتی: یەکەم شەوی هاوسەرگیریمە کە خۆشترین رۆژی ژیانمە،زۆر بەئاواتی ئەو رۆژەم کە بەچاوەکانی خۆم ببینم.

-منیش بە نیهادم گوت: باشە نیهاد ئەتوانی زیاتر بۆمی روونبکەیتەوە کەوا بۆچی یەکەم

شــــەوی هاوســــەرگیری بەلاتــــەوە رۆژێکــــی خۆشــــە؟ واتــــە دەمــــەوێت زیــــاتر بــــۆمی شــــرۆڤەکەیت کــــە لــــەو شــــەوە چــــی داهێنانێــــک روودەدات لــــەنێوان تــــۆ و خێزانەکەت؟

نیهــــادیش بــــە پێکەنینــــەوە گــــوتی: ئــــاخ ئامــــانجی هــــاوڕێم دووبــــارە خــــۆت گێــــل کــــردووە لــــەم جــــۆرە بابەتانە...

-بــــۆچی خــــۆم گێــــل کــــردووە بەراســــتمە دەمــــەوێت بــــزانم خۆشــــی ئــــەو یەکــــەم شــــەوە چییــــە؟ رەنگــــە منیش بە دڵم بێت .

نیهــــادیش بــــە دەنگێکــــی کــــزەوە پێــــی گــــوتم: یەکــــەم شــــەوی هاوســــەرگیری ئــــەو شــــەوە جوانەیــــە کــــە لەگــــەڵ کچێکــــی جــــوان و نــــەرم و تــــەڕی تــــازە پێگەیشــــتوو بۆخــــۆم لــــە ژوورێکــــدا شــــەوی ســــوور بەڕێدەکــــەم لەگەڵیــــدا. تــــۆ ســــەیری ئــــەم هــــەموو

کچانەی ناو کۆلێژەکەمان بکە چەنێک جوان و ناسکن،کەچی ناتوانین بە ئارەزووی خۆمان گانیان لەگەڵدا بکەین .بەڵام لەیەکەم شەوی هاوسەرگیریەکەم تۆڵەی هەموو ئەم کچانەی کۆلێژ لە خێزانەکەم دەکەمەوە.

- لە قسەکانی نیهاد زۆر بێزاربووم،ناچاربووم لەتەنیشتی هەڵستمەوە سەرپێ و بڕۆمە شوێنێکی تر بە ئارامی دابنیشم. چوونکە هەستم دەکرد ئەو نیهادە سوورەیە تەنیا بیرو هۆشی لەلای گەڵ و گونی خۆیەتی هیچی تری نەدەزانی لەژیان .

داماوە وای زانیووە کە ژیان بریتیە لە گەورەکردنی ئەندامە نێرنەکەیی و دەستبازی لەگەڵ کچانی تازە پێگەیشتوو. نیهادی هاوڕێم پرۆسەی هاوسەرگیری بە پرۆسەیەک دانابوو

کـــــە وا دەزانێـــــت لـــــە ڕێگایـــــەوە ئـــــارەزووە سێکســـــیەکانی پێـــــی تێردەکـــــاتن یـــــاخود هاوســـــەرەکەی، بـــــەو کچـــــە ســـــۆزانیانەی ســـــەر شـــــەقامەکان شـــــووپهاندبوو کـــــە شـــــەوان لەگـــــەڵ چەنـــــدین پیـــــاودا دەســـــتە گانێکیـــــان لەگـــــەڵ دەکەن.بـــــەڵام ئـــــەوەی مـــــن لـــــە پڕۆســـــەی هاوســـــەرگیری تێگەیشـــــتبم لـــــە گـــــانێکی شـــــەوان زۆر گـــــەورەترو جوانترە..ژیـــــانی هاوســـــەری پڕۆســـــەیەکی زۆر گەورەیـــــە کـــــە چەنـــــدین بەرپرســـــیارێتی گـــــەورە دەکەوێتـــــە ســـــەر شـــــانتەوە لە ژیان.

پـــاش شـــەش ســـاڵی ڕەبـــەق لەتـــەواوکردنی زانکـــۆم، ڕۆژێکیـــان لـــە بـــازار لەبەرامبـــەر قـــەڵات چاوەکـــانم کەوتـــــەوە نێـــــو چاوەکـــــانی نیهـــــادە ســـــوور. دوومنـــدالی بچکۆلانـــەی لەگـــەڵ بـــوو، منـــیش لێـــی

نزیک بوومەوەو سڵاوێکم لێی کرد و پێم گوت: چۆنی نیهاد ؟

ئەویش بە زمانێکی پڕ لە ماندووبونەوە وەڵامی دامەوەو وتی: هیچ باش نیم ئامانج...

-بۆچی نیهاد باش نیت؟خوانەخواستە خۆ نەخۆش نیت؟

خۆزگەم بەنەخۆشییەک ، ژیانێکی زۆر ناخۆشم هەیە هاوڕێ، هەر راکە راکمە بەتایبەتی ئەم شەش ساڵەی ژیانم زۆر ماندوو بووم. هیچ کاتێک ماندووبونی وام نەچەشتووە.

هەر ئەم دووکوڕەت هەیە نیهاد؟

کچێکی یەکساڵانیشم هەیە...

-تەمەن درێژبن بۆت...

-سووپاس ئامانج...

باشە بۆچی وا ماندوو دیاریت نیهاد؟
چـــــۆن مانـــــدوو نـــــەبم هـــــاوڕێ گیـــــان ، کەســـێکی وەکـــو منـــی کرێچـــی دەبێـــت هـــەموو ســـــەرە مانگێـــــک بـــــڕی سێســـــەدوو پـــــەنجا هـــــەزار دینـــــار بدەمـــــە کرێـــــی شـــــووقەکەمان، لەلایـــەکی تـــرەوە بـــەخێوکردنی ســـێ منـــدالّی بچـــــووک. بەڕاســـــتی ژیـــــان زۆر ئەســـــتەم بووە.پێداویســــــتەکانی رۆژانـــــە ئێجگـــــار زۆرن و ســـــەرباری ئـــــەوەش نرخیـــــان زۆر گرانـــــە. کـــە نـــاتوانم فریـــای هـــەموویان بکـــەوم لـــە یـــــەک کاتـــــدا، بەتایبـــــەتیش پێداویســـــتی و داواکـــــاری منـــــداڵ ئەوەنـــــدە زۆرە هـــــەر پڕناکرێتـــەوە بـــە ئاســـانی. ئەگـــەر وا بـــڕوات مــن ئیتــر چەنــد ســاڵێکی تــر مــووی ســپی لــە پرچـــــــــــەکانم دەردەکـــــــــــەوێت.

-منیش بە نیهادی هاوڕێم گوت: باشە هاوڕێ گیان ئەی تۆ نەبووی هەربەردەوام دەتگوت یەکەم شەوی هاوسەرگیریم خۆشترین رۆژەکانی ژیانم دەبێت!

-راستەکەی ئامانجی هاوڕێم، من تەنیا بیرم لەو شەوە بچووکە کردەوە کە تەنیا وامزانی هاوسەرگیری هەر چێژی ئەو شەوە خۆشەیە کە لەگەڵ خێزانەکەم دەستبازی و شەوی سوورمان بەڕێ دەکرد، بەڵام کەچی دواتر رۆژە سەختەکانی ژیانم هاتە پێشم. زۆر زوو پەلەم کرد لە پڕۆسەی هاوسەرگیری.

***

هیچ کاتێک گوێم لە قسەکانی تۆ نەدەگرت ، کە هەمیشە بەمن دەگوت: پەلەمەکە لە ئەنجامدانی هاوسەرگیری تا ئەوکاتەی دەبیتە خاوەنی ئابوورییەکی باش و پتەو. سەرباری ئەوەش ئێستاکە سێ منداڵم خستۆتە سەرشانی خۆم کە بەخوێوکردنیان ئێجگار ئەستەمە بۆم. ئەوکات من پێکەنینم دەهات بەو قسانەی تۆ کە دەربارەی ژیانی هاوسەرگیری دەتکرد،کەچی ئێستا گریانم بۆ ئەو قسانەی تۆ دێت کە پێش شەش ساڵ بەمنت گوت لەباخچەی زانکۆدا کە هەروەکو زێر وابوون،من تەنیا ئەوکات بیریم لای سێکس بوو، هیچی ترم نەدەزانی،تۆ کوڕێکی زۆر ڕۆشنبیری

ئامانج خۆزگە منیش بە قەد تۆ تۆزێک ڕۆشنبیر بوومایە بۆ ئەوەی وەکو تۆ کەمێک ژیانم خۆشبووایە...

-منیش لە دڵی خۆمەوە گوتم: ئەم ژیانە خۆشەی من کە ئێستا تێیدام لە سایە هەڵەکانی باوکی کۆچکردوومەوە بۆم ماوەتەوە، کە هەڵەکانی بۆ من وانەگەلێکی گرنگ بوون بۆ ژیانم.
نیهادی هاوڕێم ،ئیتر خۆت ئەم ژیانەت هەڵبژاردووە بۆیە دەبێت تا کۆتایی لەگەڵی بەردەوام بیت...
ژیانی نیهادی هاوڕێم هاوشێوەی ژیانی باوکی کۆچ کردووم دەهاتەوە پێش چاوم، کە ئەویش بە سێ منداڵەوە

ژیـــــانێکی ســـــەختی بەڕێـــــدەکرد . کـــــەچی دەرئەنجامەکـــــەی ئێمـــــە باجەکەیماندا،بـــــەڵام هیـــوادارم منداڵـــەکانی نیهـــاد بـــاجی هەڵـــەکانی باوکیـــان نەدەنـــەوە لـــە ژیانیـــان ، تـــەنیا مـــن دەزانـــم کـــە بـــاجی هـــەژاری لەتەمـــەنی منـــداڵی چەندە ناخۆش و سەختە.

((مـــن لێـــرەوە کۆتـــایی بە چیـــرۆکەکەی خـــۆم دەهێـــــنم و ئیتـــــر کـــــاتی ئەوەیە کە تـــــۆی خـــوێنەری چیرۆکـــی ژیـــانی مـــن، بڕیـــار بەی لەســـــەر ئەوەی کە چـــۆن بیـــردەکەیتەوە بـــۆ ژیانت))...؟

(ئامانج)

ئابی/2021/ هەولێر

بەرهەمەکانی نووسەر:

١.رۆژێکـــــــم لەگەڵ ئازارەکـــــانی کچێـــــک( کـــــۆمەڵە چیرۆک)

٢.پەپوولە باڵشکاوەکان(نۆڤلێت)

٣.خەرمانەی من (کۆمەڵە وتار)

٤.نامەی کچێکی مردوو(رۆمان)

٥.جەنـــــگ لەگەڵ مەرگ و ژیانـــــدا( چیرۆک)کۆتـــــا بەرهەمی قۆناغی زانکۆم...